حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# مافی مرۆڤ

## پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی

**دانەران**

حەمە صالح حەمەئەمین       چێنەر عەلی جۆلا

**چالاکیەکان**

عەبدوڵا محمد ئەمین       رەحیم سلێمان
ئەمەل جەلال محمد

**پێداچوونەوەی زانستی**

یوسف عوسمان حەمەد

چاپی دەیەم       ٢٠١٦ زایینی- ٢٧١٦ کوردی- ١٤٣٧ کۆچی

## پێشەکی:

مافی مۆرڤ بە خودی مرۆڤەوە پەیوەستە، لە یاسا سروشتی و دانراوو ئاییـنـە ئاسمانییەکانەوە سەرچاوەمان گرتووە، گەر ئەو مافانە لە هەندێك بارو كاتدا رەها نەبن و سنوریان بۆ کێشرابێت بۆ بەرژوەنـدی کۆمـەڵ ئـەوا ئەمـەش لـە بەرژەوەندی مرۆڤ خۆیەتی، چونکە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو تاکو بتوانێت لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بە ئاشتی و برایانە بژی.

هەرچەندە تا ئێستا پێناسەیەکی گشتگیرو یەکلاکەرەوە بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ نەکراوە، بەڵام دەتوانین بڵـێن (مـافی مـرۆڤ پێـوەر گـەلێکی سـەرکین و تـاك ناتوانێت بـێ ئـەوان ژیـانێکی شـکۆمەندانەی شایـستە بـە ئـادەمیزاد بەسـەر بەرێت).

مرۆڤایەتی خۆی بنەمای دادوەریی و ئاشتیەو رێزگرتن لە مـافی مـرۆڤ بـەرەو گەشەی تەواو بە کەسایەتی تاك و کۆ دەدات. مرۆڤ ئەو مافـەی بـۆ خـۆی بـە رەوای دەبینێ دەبێت بە هەمان شێوە بۆ مرۆڤی بەرامبەریشی بەرەوا ببینێت یان دەتوانین بڵێن کە ماف (هەموو ئەو بەرژەوەندییانەیە کە پێویستە رێزیان لێبگیرێت یان ئەو بەرژەوەندییانەیە کە بەپێی یاسا دەدرێن و دەپارێزرێن).

## مافی ژیان

یەکێکە لەو مافە بنەڕەتییانەی کە بە مرۆڤەوە لکاوە، هیچ کەس و لایەنێك بۆی نییە لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەو مافە لە مرۆڤ بسەنێتەوە، ئەم مافە لە زۆربەی رێککەوتننامەو پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان دوپات کراوەتەوە.

هەروەها لەسەر ئاستی نیشتمانیش وڵاتان ئەم مافە لە یاساو دەستورەکانیاندا دەچەسپێنن. ئایینە ئاسمانییەکانیش پیرۆزی مافی ژیانیان سەلماندوەو توندترین سزایان بۆ پێشێلکارانی ئەم مافە داناوە.

ئەم مافە بۆ سەرجەم مرۆڤەکان دوپاتکراوەتەوە بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان مرۆڤێك و یەکێکی تر. پێشێلکردنی ئەم مافەش لە چەند بوارێکدا دەردەکەوێت وەك بەرپابوونی جەنگەکان کە تێیاندا مرۆڤەکان دەبنە قوربانی و سوتەمەنی ئەم جەنگانە، ئیتر چ جەنگاوەر بن یان خەڵکانی مەدەنی، بەشداری شەڕیان کردبێت یان نەیانکردبێت. هەروەها کاتێکیش مرۆڤەکان تاوانی کوشتن ئەنجام دەدەن دەبنە پێشێلکاری ئەم مافە بۆیە دەبینین لە یاساکاندا توندترین سزا بۆ بکوژان دەست نیشانکراوە. هەروەها پەیڕەوکردنی سزای لە سێدارەدان کە لە هەندێك وڵات پەیڕەو دەکرێت و لە زۆربەشاندا ئەم سزایە هەڵگیراوە، چونکە سزایەکی نامرۆڤانەی تەندەو نابێتە هۆی چاکردنی تاوانبارانو لەکاتی هەڵەکردن لە جێبەجێکردنی ئەم سزایە ناکرێت ئەم هەڵەیە چاکبکرێتەوەو ژیانی بێتاوانێك کە بە هەڵە ئەم سزایەی بەسەردا سەپێندرابێت بگێڕدرێتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی مافی ژیان لە مرۆڤ دەسێنیتەوە کە لە بنەڕەتدا مافێکی پیرۆزەو ناکرێت بسەندرێتەوە.

بارێکی دیکەی پێشێلکردنی ئەم مافە لە ناوبردنی کۆرپەیە لەسکی دایکیدا (لەباربردن) کە بە گوێرەی یاسا دانراو ئاسمانیەکان کارێکی نایاساییە، سزای هەیەو بە پێشێلکردنێکی گەورەی مافی ژیان دەژمێردرێت.
بەندی سێیەمی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ دەڵێ: " هەموو کەسێك مافی ژیانو ئازادیو لە خۆ دڵنیایی هەیە" واتە رێ نادرێ، بەهیچ بیانوویەك مافی ژیان لە کەس زەوتکرێ. بەندی یەکەمی جاڕنامەکەش دەڵێ: "هەموو مرۆڤ، ئازادو شکۆمەندو یەکسان لە دایکدەبن، هۆش و دەروونیان پێبەخشراوەو پێویستە برایانە رەفتار لەگەڵ یەکدیدا بکەن.". ئەم بەندە جگە لە مافی ژیان، مافی ئازادیو یەکسانیشی لە خۆ گرتووە.

## ڕاهێنان

- یەکێك بە دەنگی بەرز بەندەکان بخوێنێتەوە.
- کێ بەباشی لە بەندەکان گەیشتووە بۆمانی باسکات.
- لەو بەندانەدا جگە لە ئازادیو شکۆمەندیو یەکسانی چیدی بەدی دەکرێ.
- شێوەکان پێشێلکردنی مافی ژیان بژمێرە؟

# چالاکی

مامۆستای وانەی مافەکانی مرۆڤ.. وانەی چوارەم چووە پۆلەوە..

دوای رۆژباش لە خوێندکارەکانی پرسی:

کێ ئەمڕۆ دەنگوباسێکی نوێی پێیە؟..

خوێندکارەکان هەندێ لەو هەواڵانەیان گێڕایەوە کە لە تەلەفزیۆن و رادیۆو رۆژنامەو گۆڤارەکانەوە وەریانگرتبوو..

مامۆستا دوێنێ شەو لە کەناڵەکانی راگەیاندن، چەندین دیمەنی ترسناك پیشان دەدرا، شەڕو پێکدادان لە نێوان شەرکەرەکاندا ببووە مایەی کوشتن و بریندار کردن و بەرکەوتنی خەڵکانی بێ تاوان.

مامۆستا وتی: ئەنجامدانی ئەم جۆرە شەڕو پێکدادانانە بەرامبەر بە مرۆڤ پەڵەیەکی شەرمەزاریە بەناوچەوانی ئەنجام دەرانی شەڕەوە.

مامۆستا لەسەر قسەکانی رۆیشت و وتی: ئێستا من زۆر دڵخۆشم بەوەی خوێندکارەکانم بە پەرۆشەوەو بەردەوام گوێ لە هەواڵەکان دەگرنو ئاگاداری رووداوەکانی ناوەخۆو دەرەوەن..

پاشان مامۆستا چەندین نمونەی دڵتەزێنی بۆ خوێندکارەکان هێنایەوە.. دواجار مامۆستا سێ گروپی لە قوتابیەکان درووستکرد.. وتی ئێستا من هەندێ پرسیارتان بەرەوڕوو دەکەمەوە.. بە ئومێدم هەر گروپە لەناو خۆیاندا وتوێژی لەسەر بکەن.. دەشتوانن لە دەرەوەی خوێندنگە لە گەلێك سەرچاوەی ترەوە زانیاری لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکان کۆبکەنەوە تابتوانن لەوانەی داهاتوودا نوێنەری هەر گروپە بێت لەبەردەم سەرجەم خوێندکارەکاندا راپۆرتی گروپەکەی بخوێنێتەوە.. بۆ ئەوەی بەڕاو بۆچوونی

ئامادەبووان ئەو راپۆرتانە پاکوپوخت بکرێن و لە پوختەی هەر هەموویان راپۆرتێکی دروست و لەبار دەربارەی مافی ژیان ئامادە بکەین.

## پرسیارەکان:

- ئایا لە روانگەی ئایینی و یاساییەوە مرۆڤ تاوانی هەرچۆنێك بێت دەکرێت سزای کوشتن بدرێت؟
- ئایا دەتوانیت لە کوردستاندا دوو نمونەی رووداوی واقیعی لەو جۆرە تاوانانە بۆ هاوەڵە خوێندکارەکانت ئاشکرا بکەیت؟
- بەگوێرەی بەندی سێی جاڕنامەی جیهانیی دەتوانیت باسێکی زیاتری مافی ژیان بکەیت؟

## مافی هاوولاتیبوون

نیشتمان یەکێکە لە بنەماکانی دەوڵەت، لەسەر نیشتمانیش مرۆڤەکان دەژین، بۆیە مرۆڤ مافی هاوولاتیبوونی هەیە لە ولاتەکەی خۆیدا، لە بەندی ١٥ جاڕنامەی گەردونیدا هاتووە:

أ) **هەموو کەسێك مافی هاوولاتی بوونی هەیە.**

ب) نابێت کەس مافی هاوولاتیبوونی لێبسەنرێتەوەوە، یان نکۆڵی لە مافی گۆڕینی بکرێت.

دروست بونی پێوەندی لە نێوان هاوولاتیبونی و دەوڵەتدا لە ڕێگەی ڕەگەزنامەوە دەکرێت کە پێوەندیەکی سیاسییو یاساییە مرۆڤ بە ولاتەکەیەوە دەبەستێتەوە.

مرۆڤ لە ڕێگەی ڕەگەزنامەوە مافەکانی وەك مافی موڵکداری، مافی وەرگرتنی وەزیفەی گشتی.... هتد لە نێو ولاتەکەیدا دەستەبەر دەکات و ئەرکەکانیشی لە ئەستۆ دەگرێت، بۆیە نابێت لە هیچ بارو کاتێکدا ڕەگەزنامە لە مرۆڤ بسەنرێتەوە.

مافی هاولاتیبون دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی یەکسانبونی هاولاتیان لە مافو ئەرکەکانیدا کە دەبێتە هۆی دروستبونی هەستی هاونیشتمانیبون و پێکەوە ژیان بە ئاشتیانەو خۆشەویست بوونی نیشتمان.

کاتێك مرۆڤ ولاتەکەی خۆی بەجێدەهێڵێت و دەچێتە ولاتێکی ترەوە، لەپاڵ پاراستنی ڕەگەزنامە بنەڕەتیەکەی، مافی وەرگرتنی ڕەگەزنامەی ئەو ولاتەی هەیە تاوەکو دەرئەنجام مافەکانی خۆی دەستەبەر بکات و شاد بێت بە مافی هاوولاتیبون.

## چالاكی:

مامۆستا بەشێوەیەكی سادە لەسەر تەختە ڕەشەكە لەنێو سێ بازنەی جیاوازدا دەنوسێت (كوردستان، فەڕەنسا، عێراق)و لە ژێر هەر یەكێكیاندا ئەم دەستەواژانە دەنوسێت.



مافی هاووڵاتیبون مافێكی سروشتیو بنەڕەتی هەموو مرۆڤێكە.



مرۆڤ مافی داواكردنی ڕەگەزنامەی هەیە لەهەر وڵاتێك كە بیەوێت



مافی هاووڵاتیبون مافێكە نابێت كە زۆر لە هیچ كەسێك بسەنرێتەوە.

پاشان داوا لە خوێندكاران دەكرێت كە بە گوێرەی حەزیان بۆ بوون بە هاووڵاتی لە هەریەكێك لەو بازنانە دابەش ببن، دواتر ئەم پرسیارانەیان ئاراستە دەكرێت:

١- مافی هاووڵاتی بوون لای تۆ چ مانایەكی هەیە؟

٢- بەچ بڕوانامەیەك هاووڵاتی بوون دەسەلمێنرێت؟

٣- چی وایلێكردیت حەز بكەیت ببیتە هاووڵاتی یەكێك لەو بازنانە؟

٤- ئایا هیچ كەس و لایەنێك بۆی هەیە مافی هاووڵاتی بوون لە یەكێكی زەوت بكات؟

٥- ئایا جیاوازی لە (رەگەز، ئاین، نەتەوە) لە دەوڵەتێکدا، هۆکارێك دەبن بۆ بێبەشکردنی مرۆڤ لە مافی هاوولاتیبوون؟

٦- هەڵوێستت چۆن دەبێت ئەگەر مافی هاوولاتی بوونت لێ بسەنرێتەوە؟ چ رێگەیەك بە گونجاو دەزانیت بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەو مافە؟

## ئازادیی تاکە کەس

ئازادیی تاکەکەس لەمافە شارستانیو سیاسییەکانی مرۆڤن کە ئەم مافانە بە دوو خاڵی سەرەکی جوێدەکرێنەوە:

یەکەم: مافگەلێکن دەتوانرێ یەکسەر جێبەجێبکرێن. مەبەست لە راستەوخۆ جێبەجێکردن و رێزگرتنیان، دوانەخستنیانە، چونکە بە هەر بیانوویەکەوە پشتگوێخرێ، مەترسییەکی گەورە لەسەر تاکو شکۆمەندییەکی دروست دەکات.

دووەم: مافگەلێکن پێویستیان بە تواناو داراییەکی زۆری دەوڵەت نییە. تەنیا ئەوەندە لەسەر دەوڵەت دەکەون کە پێشێلیان نەکات. بۆ نموونە ئەو بەڵێنە بەرێتە سەر کە بۆ ئەشکەنجە نەدانی مرۆڤ دەیدات، ئەویش لەوەندە زیاتری لەسەر ناکەوێت کە ئازارو ئەشکەنجەی کەس نەدات.

هەموو کەس لە هەڵبژاردنی بیروڕادا ئازادەو نەبێ کەس بە زۆری شتێکی بەسەردا بسەپێنرێ کە خۆی بروای تەواوی پێی نەبێ.. مافی ئازادیو بیروڕا دەربڕین یەکێکە لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ، تا رادەیەکی باشیش پێوەری دیموکراتی بوونی هەر رژێمێکی سیاسییە. مافی ئازادی بیرورا خۆی لە خۆیدا ئامانج نییە، بەڵکو شێوازێکە بۆ چاککردنی کۆمەڵگەو هەر یەکێك لە دەزگاو دەربڕینە جیاوازەکانی بۆ بەرزکردنەوەو پەرەپێدانێك کە بەرژوەندی گشتی بێنێتە کایەوە، مەرجی وەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئازادە... مرۆڤ ئازادە بەشداری هەر کۆمەڵەو رێکخراوێك کە خۆی هەڵیبژێرێ.. دیسان پێویستە مرۆڤ بەپێی رێسای دەوڵەتەکەی، لە هەڵبژاردندا ئازاد بێتو بە بیانووی پڕوپووچ ئەو مافەی لێ زەوت نەکرێ.

بەندی نۆزەدەیەمی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ لەو ڕووەوە دەڵێ:

"هەموو کەسێك مافی ئازادی بیروڕاو رادەربڕینی هەیە، ئەم مافەش هەڵگرتنی بیروڕا بەبێ خۆتێکەڵکردنی کەسێکی دیکە و وەرگرتنی هەواڵ و

بیروباوەڕو بڵاوکردنەوەیان بەهەر شێوەیەك و بێ خۆبەستنەوە بەسنووری جوگرافی دەگرێتەوە".

ئازادییەکی دی تاکەکەس هەڵبژاردنی جلوبەرگە. نابێ بە هیچ جۆرێك جلوبەرگێکی تایبەتی بەسەر کەسدا بسەپێنرێ، رێبدرێ هەر کەسە بەدڵی خۆی جلوبەرگ لەبەرکات. کەسەکە روو لە هەرکوێیەك بکات دەبێ خۆی، لە ئەزموونی خۆیەوە دەرك بە شیاوی‌و نەشیاوی جۆری ئەو جلوبەرگە بکات کە هەڵیدەبژێرێ. لە هەموو دونیادا بەپێی رۆژگارو ئەو سەردەمەی کەسێکی تیادا دەژی، هەر شتە باوی خۆی هەیەو نابێ کەسیش بە زۆر لە هەڵبژاردنی شتێکی باوی سەردەمی خۆی بێبەشکرێ.

سەبارەت بە ئازادی هەڵبژاردن و پەیڕەوکردنی ئایین دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

١- نابێت کەس دووچاری گوشارێك بکرێتەوە کە لە ئازادی ئایین و باوەر کەم بکاتەوە تەنها لەو بوارانەدا نەبێت کە یاسا بە پێویستی دەزانێت بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتی و رژێمی گشتی و تەندروستی گشتی و خووڕەوشتی گشتی و مافی خەڵکانی تر و ئازادیە بنەڕەتییەکان.

٢- نابێت ئازادی لە دەستەبەرکردنی ئایین و بیروباوەڕ ببنە سەرچاوەیەك بۆ توندڕەویی.

٣- نابێت ئەو ئایین و باوەڕەی منداڵی پێ پەروەردە دەکرێت ببێتە هۆی زیان پێگەیاندنی جەستەیی و ئەقڵی و گەشەکردنی.

## چالاکی:

ئەنجامدانی چالاکی (کارتی ئازادی بیروڕا) کە لەلایەن مامۆستاوە بەگوێرەی رێبەری مامۆستا جێبەجێدەکرێت.

# مافی پەروەردە و فێرکردن

مافی پەروەردە و فێرکردن، بەمافی تاکە کەس دادەنرێ و دەبێ هەموو کەس مافی خوێندنی هەبێ و لانی کەم قۆناغی سەرەتایی بەزۆر بێ، چونکە یەکێك لە دەردە کوشندەکانی کۆمەڵ نەخوێندەوارییە. مافی خوێندن یەکێکە لە مافە سەرەکییە گرنگەکانن مافێکی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیرییە، جگە لە هەموو ئەوانەش دەکرێ بە مافێکی شارستانی و سیاسی دابنرێ، چونکە کاریگەریی لەسەر کاری مافەکانی دی هەیە. کەسێکی خوێندەوار بێگومان زۆر بەئاگاترە لە ئەرك و مافەکانی خۆی وەك لە نەخوێندەوارێك. ئەمانەی خوارەوەش ئاماژە سەرەکییەکانی مافی خوێندنن:

**یەکەم:** دابینکردن...پێویستە دەزگاو بەرنامەی خوێندن بەشێویەکی رێکوپێك دابین بکرێن و بخرێنە بەردەست.

**دووەم:** ئاسانکاری بۆ گەیشتنی هەمووان بەو دەزگایانە، ئەویش بە:

– جیاوازی نەکردن: پێویستە لەلایەك یاساو لەلایەکی تریشەوە بە کردەوە خوێندن بۆ هەمووان بێت و بەهیچ شێوەیەك و لەسەر هیچ بنەمایەك جیاوازیی لە نێوان پێوەندیدارەکاندا نەکرێ.

– قوتابخانە و خوێندنگە لە نزیك ماڵەکان و لە شوێنێکی وادا بکرێن کە هاموشۆکردن بۆی ئاسانبێ.

– لە رووی ئابووریشەوە، پێویستە خوێندنی سەرەتایی خۆرایی بێ‌و هەوڵی بەردەوامیش بۆ بە خۆرایی کردنی ناوەندی و ئامادەیی خوێندنی باڵا بدرێ.

**سێیەم:** پێویستە دانەرانی بەرنامەی خوێندن رەچاوی تایبەتمەندێتی رۆشنبیریی بکەن و شێوەو ناوەرۆکی بەرنامەی خوێندن و شێوازی وتنەوەی زانستیانە بێت و دوربێت لە توندوتیژی.



جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤیش بەندی ٢٦ی بۆ مافی فێربوون تەرخانکردووە:

١- هەموو کەس مافی فێربوونی هەیەو دەبێ بەلای کەمەوە پلەی سەرەتایی‌و بنەڕەتییەکانی خوێندن بە خۆڕایی بن و دەبێ خوێندنی سەرەتایی بەزۆربێت و خوێندنی هونەریی و پیشەییش بڵاوبکرێتەوەو وەرگرتن لە خوێندنی باڵا بە یەکسانی تەواو بۆ هەمووان و بەپێی توانا ئاسانبکرێ.

٢- دەبێ ئامانجی پەروەردە، پێگەیاندنێکی تەواوی کەسایەتی مرۆڤ و پتەوکردنی رێزی مافەکانی مرۆڤ و دۆستایەتی لە نێوان هەموو گەلان و کۆمەڵە رەگەزیی یان چاوپۆشیکردن و دۆستایەتی لە نێوان هەموو گەلان و

کۆمەڵــە ڕەگــەزیی یــان ئاینییەکانــدا و زیــادکردنی کۆشــشی نەتــەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی ئاشتی بێت.

٣- باوکان و دایکان خاوەنی مافی یەکەمن لە هەڵبژاردنی شێوەی پەروەردە کردنی منداڵەکانیان.

## چالاکی:

بەبیری خۆت چیرۆکێك لەسەر یەکێك لەم دوو بابەتەی خوارەوە ئامادە بکە:

١- پوورە گوڵە ئافرەتێکی نەخوێندەواری گوندنشینی تەمەنی (٤٥) ساڵە، لەشێوەی چیرۆکێکدا هۆکاری بێبەشبوونی لە مافی خوێندن لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بنووسە:

أ- ئایا هۆی نەخوێندەواریی پوورە گوڵە چییە؟

ب- ئایا لە گوندەکەیان قوتابخانە هەبووە؟

جـ- ئایا ڕێگریی خێزانیی هەبووە لە بەردەم پوورە گوڵەدا بۆ چوونە نێو قوتابخانە؟

د- ئایا پوورە گوڵە حەزی دەکرد بخوێنێت؟

٢- هاوڕێ کوڕێکی تەمەن ١١ ساڵە و لە دوکانێکدا کار دەکات، لەگەڵ ئەوەی زۆر حەز لە خوێندنە، بەڵام بەهۆی کارکردنەوە لە مافی خوێندن بێبەشە.

لەشێوەی چیرۆکێکدا هۆکاری بێبەشبوونی لەمافی خوێندن لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بنووسە:

أ- بۆچی هاوڕێ ناچێت بۆ قوتابخانە؟

ب- بۆچی هاوڕێ کاردەکات؟

ج- ئایا بە رای تۆ منداڵ دەبێت لەو تەمەنەدا کار بکات؟

د- ئایا دەوڵەت هیچ هاوکارییەکەی هاوڕێی کردوە بۆ ئەوەی لە مافی خوێندن بێبەش نەبێت؟

## راهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

- بەرای تۆ هۆی نەخوێندەواری پوورە گوڵەو هاوڕێ جیاوازن؟
- پوورە گوڵەو هاوڕێ چ مافێکیان پێشێل کراوە؟
- کێ لە نەخوێندەوارێتی پورە گوڵە بەرپرسیارە؟
- دەبێت دەوڵەت چی بکات بۆ پوورە گوڵەو هاوڕێ تا لە خوێندن بێبەش نەبن؟
- هەڵوێستی تۆ چۆنە بەرامبەر کارپێکردنی منداڵ؟

# مافی هاوسەرگرتن

بەندی (١٦):

(أ): پیاوو ژن کە گەیشتنە تەمەنی هاوسەرێتی مافی پێکهێنانی خێزانیان هەیە بە بێ گوێدان بە جیاوازیی رەگەزو ئایین.

(ب): مارە بڕی تەنیا بە رەزامەندی سەربەستانەی تەواوی ژن و پیاو دەبێت.

(جـ): خێزان یەکەیەکی سروشتی و بنەڕەتیی کۆمەڵگەیە مافی پاراستنی هەیە لەلایەن کۆمەڵگەو دەوڵەتەوە.



خێزان یەکەیەکی کۆمەڵایەتییەو کۆمەڵگەی لەسەر دروست بووە، مرۆڤ و ژیان پێویستیان بە هاوسەرێتی هەیە تا بەردەوام بن، مرۆڤ دەبێت ئازاد بێت لە هاوسەرگرتن، بەشێوەیەك کە ئیرادەی خۆی تێدا بەرجەستە بکات، چونکە لە بنەڕەتدا هاوسەرێتی بریتییە لە یەکگرتنی ئیرادەی ژن و پیاو و ڕەزامەندییان لەسەر پێکهێنانی خێزان. یاسا ڕۆڵی ڕێکخەر دەبینێت لە دیاریکردنی ماف و ئەرکی ژن و پیاو پاشان دیاریکردنی چارەنووسی (منداڵ) لە ڕێگەی چەسپاندنی ڕەچەڵەك و ئەو مافانەی لێی دەکەوێتەوە.

لە هاوسەرێتیدا دەبێت ئەم خاڵانە ئەنجام بدرێت:

١- بەپێی یاسا کاتێك هاوسەرێتی دروست دەبێت کە بە ڕەزامەندی هەردوولا بێت و زۆرە ملێی تیا نەبێت. پێویستە بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوون لەلای دادگای باری کەسێتی ڕەزامەندییان بخەنە ڕوو.

٢- تەمەنی هاوسەرێتی دەبێت لە (١٥) ساڵ کەمتر نەبێت، لە ڕووی یاساییەوە هاوسەرێتی دروست نابێت گەر لەو تەمەنە کەمتر بێت.

٣- پێویستە تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرێتی لەلای دادگای باری کەسێتی بێت.

٤- دەوڵەت دەبێت کار ئاسانی بۆ هاوسەرێتی بکات، پاراستنی یاسایی بۆ تایبەتمەندیی ژیانی خێزان دەستەبەر بکات.

## چیرۆك:

قوتابخانەیەکی کچان ژووری بەڕێوەبەر.

دایك: ڕۆژ باش مامۆستا.

بەڕێوەبەر: ژیانت باش.

دایك: مامۆستا دەمەوێت کچەکەم بگوێزمەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر، بەڵکو بەڵگەنامەی گواستنەوەی بۆ بکەیت.

بەڕێوەبەر: دەبێت لە پێشەوە ڕەزامەندی لەو قوتابخانەیەوە بهێنیت، پاشان بەڵگانامەی گواستنەوەی بۆ دەکەین.

دایك: مامۆستا ڕەزامەندیم هێناوە کە جێگایان هەیە.

بەڕێوەبەر: باشە خۆ ساڵی خوێندن زۆری نەماوە بۆچی بەم کۆتایی ساڵە دەیگوێزێتەوە؟ بەراستی کچەکەت زۆر باش و بەتوانایە.. ماڵتان گواستۆتەوە وا دەیگوێزێتەوە؟

دایك: نەخێر مامۆستا لەگەڵ هاوسەرەکەم جیابووینەتەوە ئێستا من دەچمەوە ماڵی باوکم و کچەکەشم لەگەڵ خۆم دەبەم... پێش هاوسەرێتیمان یەکترمان نەناسیبوو لێك تێگەیشتن لە نێوانماندا نەبوو لەو کاتەوە تا ئێستا ژیانمان هەر شەڕو ئاژاوە بوو چارەنووسی هاوسەرێتیمان بە جیابوونەوە کۆتایی هات.

بەڕێوەبەر: بەداخەوە کەواتە بەیانی دوو وێنەی کچەکەت بێنە.

## ئەرکیماڵەوە:

ئەم پرسیارانە وەڵام بدەرەوە:

١- خێزان چییە؟

٢- پێکهاتەکانی خێزان چین؟

٣- بۆ دروست کردنی خێزانێك بەختەوەر مەرجەکانی هاوسەرگرتن کامانەن؟

٤- ئایا رێزگرتن لە راو بۆچوونی یەکتری مەرجە بۆ بەردەوامی و بەختەوەریی خێزان؟

٥- ئەو خێزانانەی کە هەمیشە شەڕو ئاژاوەی تێدایە دەرئەنجامی چۆنە؟

٦- بیرت کردۆتەوە، لە پاشەڕۆژدا چۆن هاوسەر بۆ خۆت هەڵدەبژێریت؟

## پاراستن لە توندوتیژی

بەندی (٥):

هـیچ مرۆڤێـك ئـازارو ئەشـكەنجە نادرێـت و رەفتـاری توندوتیـژو درِندانـەی ئابروبەرانەی لەگەڵ ناكرێت.



هەموو كەسێك مافی پاراستنی لە توندوتیـژیی و مامەڵـەی نـارەوا هەیـە، جـا دەسـەلاّت بیكـات یـاخود لەلایـەن مرۆڤێكـی تـرەوە رووبـەرووی بكرێتـەوە بەتایبـەتیش بـەكارهێنانی ئەشـكەنجەو مامەڵـەی نـارەوای دژ بـە كەرامـەتی مرۆڤ، یاسا دەبێـت مـرۆڤ لـە توندوتیـژیی بپارێزێـت، هـەر مرۆڤێك دووچـاری توندوتیژیی بووەوە مافی پەنا بردنە بەر دادگای هەیـە، بۆیـە پـەنا بـردن بـۆ كـاری توندوتیـژیی و بـەكارهێنانی هێـز دژی مـرۆڤ بـە تـاوان دادەنرێـت. بەكارهێنانی شێوازە نارەواكان بۆ وەرگرتنی زانیاری دان پیانان (ئیعتیراف)و

دروستكردنی هەلومەرجی ترساندن و زۆر لێكردن بەمەبەستی هاندان بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندیی لەسەر كارێك بە پێشێلكردنی ئەم مافە دادەنرێت.

یەكێك لە جۆرەكان توندوتیژیی بریتیە لە كرداری ئەشكەنجەدان كە بە پێشێلكارییەكی سەرەكی مافەكانی مرۆڤ دەژمێردرێت، لە حاڵەتی زیندانیكردن و دەستبەسەراگرتن ئەنجام دەدرێت چ لەسەر كەسی زیندانكراو یان لایەنی سێهەم (واتە ئەشكەنجەدانی كەسێكی دیكەی نزیك لە كەسی زیندانی كراو بەمەبەستی زانیاری لێی)، ئەم كردارە بریتییە لە هەر كارێكی بە ئەنقەست كە ببێتە هۆی ئەوەی ئازارێكی زۆر بە كەسێكی دیاریكراو بگەیەنێت چ لە ڕوی جەستەیی یاخود دەرونیی، دەبێت ئەنجام گەیەندرابێت بەمەبەستی:

– وەرگرتنی زانیاری یان ئیعتراف وەرگرتن لە خۆی یان لە كەسی سێهەم.

– ئازاردان لەسەر كارێك خۆی یا لایەنی سێهەم كردبێتی یان گومانی كردنیان لێبكرێت.

– تۆقاندن و ملكەچ پێكردنی خۆی یان لانەی سێهەم.

## ڕاهێنان

دەكرێت چەند شێوازێك لە توندوتیژیی بنوسیت؟

ئایا بڕوات بە توندوتیژیی هەیە لە بەڕێوەبردنی كارەكانتدا؟

ئایا مامۆستاكانت توندوتیژیی بەكاردەهێنن لە وتنەوەی وانەكانیاندا؟

## ژن و پیاو لە مافدا یەکسانن

لــە بەشــێکی بەنــدی (٣)ی ڕێکەوتنامــەی تایبــەت بــە مافــە ئــابوریی و کۆمەلایەتییەکان هاتووە: (دەوڵەتـە لایەنـدارەکان لـەم بەڵێننامـەی ئێستادا بەڵێن دەدەن بە یەکسانی مافی ژن و پیاو دەستەبەربکەن).

ژن و پیاو لە بنەڕەتدا دەبێت لە ماف و ئەرکدا یەکسان بن، ئەو جیاکارییـەی ئێستا لە بەشێك لـە کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیـدا پیادەکرێت دەستکردی مـرۆڤ خۆیەتی و ئەزەلی نییە، دەبێت ژن و پیاو بە یەکسانی بەشداری چالاکانەیان هــەبێت لــە بــەڕێوەبردنی ژیانیانــداو بەیەکــسانی دەرفــەت لەبەردەمیانــدا برەخسێنرێت لە گشت بوارەکانی ژیاندا وەك (کارکردن، بەشداری سیاسـیی، بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی).

## راهێنان

١- ئایا باوەڕت وایە کە ژن و پیاو لە مافدا یەکسانن؟

٢- ئایا دەبێت دەرفەتی یەکسان بۆ کارکردن و وەرگرتنی پلەوپایە لە نێوان ژن و پیاو هەبێت.

٣- ئایا باوەڕت وایە کە ژن و پیاو لە مافە سیاسییەکانیاندا وەك مافی هەڵبژاردن یەکسانن؟

٤- ئەو هۆکارانە چین کە دەبنە هۆی جیاوازیکردن لە نێوان ژن و پیاودا؟ باوەڕت پێیان هەیە.

## چیرۆك:

لەکاتی سەردانی مام حەسەن بۆلای پزیشك ئەم گفتوگۆیە روویدا:

پزیشك: حاجی بەخێربێت، ناوت چییە؟ خەڵکی کوێیت و کارت چییە؟

مام حەسەن: ناوم (مام حەسەن)ە، خەڵکی دێهاتم، ئیشم ئاژەڵداریی و جوتیارییە، خێزانەکەم ناوی (رەحمە)یەو نەخۆشە.

پزیشك: (رەحمە خان) چیتە؟

رەحمە خان: هەموو گیانم دێشێ.

پاش پشکنین، پزیشك وتی: هۆی نەخۆشیەکەت هیلاکیی و ماندوو بوونە.

مام حەسن هەڵدەداتێ و دەڵێ: خێزانەکەم ژنی ماڵەوەیەو کارناکات، ئیتر بەچی هیلاك دەبێت.

پزیشك: چەند منداڵتان هەیە؟

مام حەسەن: ٩ منداڵ.

پزیشك: (ڕەحمە خان) ڕۆژ چۆن بەسەر دەبەیت و بەیانی کەی هەڵدەستیت؟

ڕەحمە خان: بەیانیان پێش مەلابانگدان هەڵدەستم، مەڕو ماڵاتەکەمان دەردەکەم و گەوڕەکەیان پاك دەکەمەوە، دوایی چاپی لێ دەنێم و بەرچایی دەدەم بە منالان، پاشان مەشکە دەژەنم و ماڵ پاك دەکەمەوەو جل و بەرگ دەشۆم، ئاو لە کانی دەهێنم و نانی نیوەڕۆ ئامادە دەکەم و دەیبەم بۆ مام حەسن بۆ سەر کار.

پزیشك: تۆ نیوەڕوان ناچیتەوە بۆ ماڵ؟

مام حەسەن: نەخێر لەو دەشتە خەریکی بژار کردنم.

پزیشك: دوای ئەوە چی دەکەیت.

ڕەحمە خان: پاش هاوکاریی کردنی مام حەسەن لە بژار ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵ، نانی ئێوارە ئامادە دەکەم. شەویش پاش گەڕانەوەی ئاژەڵەکان دەیاندۆشم.

پزیشك: مام حەسەن، تۆ ناڵێی ژنەکەم کاری نییەو کار ناکات؟!

مام حەسەن: ئاخر ژنی ماڵەوەیە!!! ئیشی چی دەکات؟

## پرسیار:

١- بەرای ئێوە ئەو ژنە کار دەکات یان بێ کارە؟ چەند سەعات کار دەکات؟

٢- چی وای لەمام حەسەن کرد کە بڵێ ژنەکەم بێ کارە؟

٣- بەراورد بکە لە نێوان کاری مام حەسەن و کاری خێزانەکەی؟

٤- ئایا پیاوان کاری ماڵەوە دەکەن؟ ئەو کارانە چییە کە دەیکەن؟

٥- هەست دەکەیت لە خێزانەکەتدا جیاکاریی لە نێوان کچ و کوڕدا هەیە؟

## جیاوازیی نەکردنی لەبەردەم یاسادا

بەو پێیەی مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو بەتەنها ناتوانێت بژیو دەبێت لە کۆمەڵگەدا بێت، پێویست دەکات رێکخستنی پێوەندییەکانی (ئەرك و ماف) لە چوارچێوەی یاساو داب و نەریتەکاندا رێکبخات.

یاسا، کە پێوەندیو هەڵسوکەوتی هاووڵاتیان دیاریی دەکات و رێکیان دەخات، پێویستە گشتێبێ و لەسەر هیچ بنەمایەك جیاوازیی لە نێوان کەسێك و کەسێکی دی دانەنێ. جیاوازیکردن دەبێتە هۆی پێشێلکردنی ئەم مافە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە گیانی ناکۆکی و بەگژداچوونەوە بەرپا دەکات و پشێوی دەخاتە وڵاتەوە.

لە هەموو وڵاتێکیشدا پێویستە یاسا سەروەر بێت، واتە کەس لەسەرو یاساوە نەبێت یاسا جیاوازیی نەکات لە نێوان مرۆڤەکان، بەندەکانیشی پارێزەری مافەکان بێت نەك پێشێلکار.



لەبەر گرنگی ئەم مافە جارنامەی جیهانیی مافی مرۆڤ لە چەند بەندێکدا جەختی لەسەر کردووەو دەڵێت:
هەر کەسێك لە هەر شوێنێك بێت مافی دانپێدانانی کەسایەتی یاسایی هەیە، هەموو مرۆڤێك لەبەردەم یاسادا یەکسانەو مافی ئەوەی هەیە کە چوونیەك و بێ جیاوازیی لەلایەن یاساوە بپارێزرێت.

## راهێنان

– ئایا یاسای وڵاتەکەت یەکسانی نێوان هاووڵاتیان دەستەبەر دەکات؟
– هەست دەکەیت رێنماییەکانی خوێندنگەکەت جیاوازیی لە نێوان خوێندکاراندا دەکات؟

قوتابیان ئەم چیرۆکە چەند جارێك دەخوێننەوە (دەکرێت بە درامایەك).
خاتوو رۆزا پارکسی خەڵکی شاری مۆنتگمری ویلایەتی ئەلەبامای ئەمریکایەو کاری بەرگ درووی بوو...رەش پێست بوو...
لە ١٩٥٥/١٢/١، لەناو شاری مۆنتگمری ئەمەریکا سواری پاسێك بوو، خاتوو رۆزا مل کەچ نەبوو بۆ یاسای (جیم کرۆ) کە دەبوایە رەشپێستەکان کورسییەاکێن کە لەسەری دانیشتوون بۆ سەرنشینێکی سپی پێست چۆڵ بکەن، خاتوو رۆزا بە تۆمەتی شکاندنی ئەو یاسای جیا کردنەوەیە دەسگیرکرا... بەهۆی ئەم رووداوە کێشەی (بایکۆتی پاسەکانی مونتگمری) بەرپا بوو.
هەواڵی گرتنی رۆزا پارکس لەناو شاردا بڵاوبووەو رەشپێستەکان هەندێك چالاکیان دژی یاسای (جیاکردنەوەی رەش و سپی) ئەنجام دا، مارتن لوسەر

کینگ کە وەزیر بوو پشگیریی ئەو چالاکیانەی کرد یەکێك لەو چالاکیانە ئەوە بوو رەشپێستەکان بریاریاندا سواری پاس نەبن و بەپێ هاتووچۆ بکەن...

کۆمپانیای هاتوچۆ لە ٦٥٪ ئیشی لەدەست دا شۆفێرەکانیان لەسەر کار لابران، بەم شێوەیە ململانێیەکی ئاشتیانەی دوور لە توندوتیژیی بۆ پیادەکردنی مافی مرۆڤ دەستی پێکرد.

بە ساڵی ١٩٥٦ دا دادگای باڵای ئەمریکا ئەو یاسای جیاکەرەوەی رەش و سپییەی بە پێشێلکردنی دەستوور دانا. کۆمپانیای هاتوچۆی شاری مونتگمری رازی بوو شوفێری رەش پێست دابمەزرێنێت و بیخاتە سەرئیش. بە یەکسانی و بێ جیاوازیی مامەڵەی لەگەڵ هەموو سەرنشینەکاندا کرد.

**پرسیار:**

رات چییە بەرامبەر گرتنی رۆزا؟

رەش پێستەکان لە شاری مونتگمری داوای چ مافێکیان دەکرد؟

تۆ هەڵوێستت بەرامبەر ئەو یاسایە چۆنە؟ ئایا ئامادەی پشتگیری یا ململانێی ئەو جۆرە یاسایە بکەیت؟

رەشپێستەکان بۆ سەندنی مافەکانیان شێوازی چەکدارانەیان هەڵبژارد یان شێوازی ململانێ ئاشتی؟ تۆ کام شێوازە پەسەند دەکەیت؟

هیچ جۆرە رووداوێکی وات بیستووە کە لە وڵاتەکەتدا لەبەردەم یاسادا جیاوازیی لە نێوان هاووڵاتیاندا هەبێت.

## مافی موڵکداری

بەندی (١٧):

هەموو کەسێك مافی موڵکدارێتی هەیە چ بە تەنها یاخود هاوبەش لەگەڵ خەڵکی تردا نابێت بە ڕەمەکی موڵك لە هیچ کەس بسەنرێتەوە.

بە دەستهێنانی موڵك و ماڵ بەشێکە لە پێویستییەکانی ژیان و بۆ درێژەدان بە گوزەرانی مرۆڤ. واتا بەکارهێنانی ئەو شتەی خاوەندارێتی دەکرێت بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ، بۆیە سەرەتاترین مافی مرۆڤ ئازادییە لە موڵکداریەتی نەگواستراوەکان و گواستراوەکان، بۆی هەیە بەکاری بهێنێت و سوودی لێ وەربگرێت لێرەشدا یاسا ڕۆڵی ڕێکخەر دەبینێت بە جۆرێك کە پاراستنی یاسایی بۆ مافی موڵکدارێتی دابین دەکات و لە دەستدرێژیی دەیپارێزێت.

## چالاکی:

مامۆستا، لەوانەی مافی مرۆڤدا بەندی (١٧) جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤی بۆ خوێندکاران شی دەکردەوە کە تێیدا هاتووە: (هەموو کەسێك یان خێزانێك مافی موڵکدارێتی تایبەتی خۆی هەیە) ڕوونی دەکردەوە کە هیچ دەسەڵاتێك ناتوانێت موڵکی هیچ کەسێك زەوت بکات.

خوێندکارێك دەستی هەڵبڕی‌و وتی: (کوا مامۆستا وایە؟ ئێمە خەڵکی کەرکوکین! حکومەتی عێراقی موڵك و ماڵی لێ داگیرکردین).

خوێندکارێکی تر... سەدان گوندیان ڕووخاندو هەزارەها ماڵیان ئاوارە کرد.

مامۆستا: ئەوانەی ئێوە دەیڵێن هەمووی ڕاستە، بەڵام دەبێت بزانن هەموو ئەو کارانە پێشێلکردنی تەواوی مافەکانی ئێوە بووەو ڕۆژێك دەبێت هیچ

مافێك لە مافەكانتان پێشێل نەكرێت و قەرەبووی تەواویش لـە بەرامبـەر ئـەو پێشێلكارییانە بدرێت.

## پرسیار:

١- ئایا مرۆڤ تەمەنی هەر چەند بێت، مافی موڵكداریی هەیە؟؟

٢- دەكرێت بە هەر بیانوویەك موڵكی كەس زەوت بكرێت؟

٣- دەوڵەت دەتوانێت بە هەڕەمەكی موڵكی هاووڵاتیان داگیر بكات؟

٤- چۆن قەرەبووی پێشێلكردنی ئەم مافە بدرێتەوە؟

## مافی گەل و نەتەوە

## لە دیاری کردنی چارەنووسدا

کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی لـە نەتـەوەی جیـاواز پێکـدێت، زۆر لـە نەتـەوەکان خـاوەنی قەوارەیـەکی سیاسـیین کـە پێـی دەوترێـت دەوڵـەت. هەنـدێ لـە دەوڵـەتان زیـاتر لـە نەتەوەیـەکی تێدا دەژی، بـەپێی پەیماننامـەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان هـەموو گـەلێك مـافی دیـاریکردنی چارەنووسـی خـۆی هەیـە، دەبێت زەمینەی لەباری لەبەرمەدا بڕەخسێت تا بتوانێت قەوارەی سیاسـیی، ئابووریی و کۆمەڵایەتی خۆی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا دروست بکات.

## راهێنـان

مامۆستا خوێندکارانی پۆل دابەش دەکات بەسەر سێ گروپدا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

گروپی یەکەم: گروپی سەربەخۆیی.

گروپی دووەم: گروپی فیدراڵی.

گروپی سێیەم: گروپی مافی مرۆڤ.

هەر گروپە ئەم کارانـە ئـەنجام دەدات: گروپـی سـەربەخۆیی، ئـەم هۆکارانـە روون دەکاتــەوە کــە بۆتــە هــۆی هەڵبــژاردنی بیرۆکــەی ســەربەخۆیی بــۆ گەلەکەیان.

گروپی فیدراڵی، ئەو هۆکارانە روون دەکاتەوە کـە بووەتـە هـۆی هەڵبـژاردنی شێوەی فیدراڵیی بۆ گەلەکەیان.

گروپـی مـافی مـرۆڤ: ئـەو بەڵگەنامـەو رێککەوتننامانـە روون دەکاتـەوە کـە پشتگیریی لە دیاریکردنی مافی چارەنووسی گەلان دەکات.

لـەکۆتایی گفتوگـۆدا شـێوازی ریفرانـدۆم لـە نێـوان هـەموو خوێندکارەکانـدا جێبەجێ دەکرێت، بە ئامانجی دیاریکردنی چارەنووس.

## مافی ژینگە خاوێنی (ژینگە پارێزیی)

ژینگە، یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی بوون و پێویستە بۆ بەردەوامی ژیان پارێزگاری بکرێو خاوێن راگیرێ. ژینگە، بۆ هەمووانەو بە موڵکی مرۆڤایەتی دادەنرێ و بەشی هەرە زیندەوەرێکی پێوەیە. بۆیە مافی خۆمانە داوای خاوێن راگرتنی بکەین و نەهێڵین بە شێوەیەکی نەشیاو بۆ بەرژەوەندی ئەو کارگەو دەوڵەتانە بەکاربهێنرێ کە لە گیرفان پڕکردن و بەرژەوەندی خۆیان زیاتر، بیر لە ژیانی وەچەکانی دواتر ناکەنەوە.. ژینگە، گشت سەرچاوە سرووشتییەکان، "ئاو، هەوا، خاك، کانزا، زیندەوەرو، هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە ژێر خاك و لە ئاسماندا هەن". هەر یەك لەوانە سەرچاوەیەکی سەرەکی ژیانەو پیسبوون و شێواندنیان کاری خراپی بۆ مرۆڤایەتی لێدەکەوێتەوە.. دۆزینەوەی سەرچاوەکانی وزە "هێزی بوخار، خەڵووزی بەردین، باروود، کارەبا، نەوت و ئەتۆم و ...هتد" و بە کارهێنانیان لە بوارە جیاجیاکانی پیشەسازیداو دواتریش لە دروستکردنی چەك و گەلێ جاریش هەوڵی زلهێزەکانی ئەو کاتەو ئێستا بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەو ناوچانەی، یەکێك یان چەند سەرچاوەیەکی وزەی تیادایە، شەڕو شۆڕێکی زۆر بەرپادەبێ و هەمە جۆر چەك تیایدا بەکاردەهێنرێ و یەکبینەش سڵ لە دروستکردنی چەکی قورس و ناهەموارترو بەکارهێنانیان ناکەنەوە، بێگومان ئەوەش پیسکردنی ژینگەی لێدەکەوێتەوە...

زۆربوونی مرۆڤو پەرەسەندنی بازرگانی نێوان وڵاتان و بوونی گۆی زەوی بە بازاڕێکی گەورە، هاتوچۆو سەفەرکردن بۆتە کارێکی رۆژانەو بەهۆی بەکارهێنانی "ئۆتۆمۆبێل، شەمەندەفەر، پاپۆڕ، فڕۆکە...هتد"، کە هەریەکە بەشی خۆی وزە بەکاردەهێنێو ژینگە پیستر دەکات و لە رووی

تەندروستییەوە زیانێکی زۆر بە زیندەوەر، کە مرۆڤ یەکێکیانە دەگەیەنێ...لە زۆربەی وڵاتانی دونیای پێشکەوتوودا، کە پیسبوونی ژینگە بۆتە کێشەیەکی گەورەیان، هەوڵدەدەن لەناو شارەکاندا کەمتر ئۆتۆمۆبێل بەکاربهێنرێن، ساڵانە رۆژێك بۆ لێنەخوڕینی ئۆتۆمۆبێل تەرخاندەکەن، باجی ئۆتۆمۆبێل زیاد دەکەن، دانانی ئۆتۆمۆبێل لە شوێنی تایبەتی خۆیدا گران دەکەن، هانی خەڵکی دەدەن کە تا بتوانن پایسکل لە ناو شارەکاندا بەکاربهێنن، هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێل لە ناوەندی شارەکاندا قەدەغە دەکەن... ئەی تۆ چی بۆ کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیە پێشنیار دەکەیت؟

رۆژانە، هەر خێزانە خۆی لەبەرماوەو پیسی ماڵەکەی رزگاردەکات. وەك دەزانین، شارەوانی ئەو پاشماوانە خڕدەکاتەوەو لە شوێنێکی دوورە شاردا، یان دەسووتێنێ یان کەڵەکەی دەکات و دواتر ئەوەش دەبێتە کێشەیەکی دی پیسکردنی ژینگە... کاتی سووتاندنی، لەوانەیە گەلێك شتی تیادابێ سووتانەکەی شتی خراپی لێبێتەوەو زیانی گەورە بە تەندروستی بگەیەنێ. بۆیە هەندێ وڵات، لە بەشی خاوێنی ژینگەی شارەوانی شارەکانیاندا، بە خۆڕایی سندوق بەسەر خێزانەکاندا دابەش دەکەن و رێنماییان دەکەن تا ئەو شتانەی لە ئەنجامی سووتاندنیدا جۆرە گازێکی ژەهراوی و ترسناکی لێدەردەچێ، بخەنە ئەو سندوقەو رۆژێکیش بۆ کۆکردنەوەیان دیاری دەکرێ، تا بە جۆرێك لەناو ببرێن زیان بە زیندەوەر نەگەیەنێ...هەندێ وڵاتی سەر دەریا، پیسییەکان دەکەنە دەریاوەو ئەوەش زیانێکی زۆر بە زیندەوەرانی ناو دەریاکە دەگەیەنێ. لای خۆشمان، هەندێکەس بۆ راوە ماسی نارنجۆك دەخەنە چەمەکانەوەو چی ماسی لەو شوێنەدا هەیە، بە گەرا وردەکانیشیانەوە دەکوژن! جار هەیە، ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك زبلکۆکەرەوە

له كاتی خۆیدا نەگات، بەشێك لە دانیشتوانی گەڕەك، بێ ئەوەی گوێ بدەنە كەس زبڵەكەیان لە كەلاوەیەكی گەڕەكەكە فڕێدەدەن!! تۆ لەو ڕووەوە دەڵێی چی؟ بۆ چارەسەركردنی كێشەیەكی لەو جۆرە پێشنیارت چییە؟

كارگە پیشەسازییەكان، جگە لەو گازەی لە هەوادا بڵاوی دەكەنەوە، لە ناوبردنی پاشماوەكانیشیان، بۆتە گرفتێكی گەورەو پێویستی كاری بۆ بكرێ...

بوونی كارگە لە نزیك شارو شارۆچكەو گوندەكانەوە، زیانێكی زۆر بە دانیشتوانی ناوچەكە دەگەیەنێ، بۆیە پێویستە كارگەكان ئەوەندە لە گەڕەك و ماڵانەوە دووربن زیانیان پێنەگات.

له هەموو ئەوانەی سەرەوە گرنگتر، ئەو كارگانەن كە لە بواری ئەتۆم و كیمیاگەریی و هەندێ شتی لەو بابەتانەدا كاردەكەن، ئێستا پاشماوەی ئەم كارگانە بوونەتە كێشەیەكی گەورەی مرۆڤایەتیی‌و چەندین ڕێكخراوو حیزب بۆ ڕێزگرتن لە بوونی ئەو جۆرە كارگانە پەیدابوون. حیزبی سەوز لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپاییەكاندا هەیەو بەگژ ئەو كارگەو حكومەتانەدا دەچنەوە كە پاشماوە ترسناكەكانی كارگەكانیان دەخەنە ژێر زەوی یان دەریاوە...

ژینگەپارێزی وەك مافێكی مرۆڤ، كە لەگەڵ پەرەسەندنی كۆمەڵگەو پیشەسازییدا سەری هەڵداوە، گرنگییەكی زۆری هەیە، چونكە مەسەلەیەكە سەرجەم مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. ئێستا بایەخێكی لە ڕادەبەدەری پێدەدرێ و تا دێت خەڵكی زیاتر بە پیرییەوە دەچن.. ئەی تۆ نابیتە یەكێك لەو پشتگیریكەرانە؟

## راهێنان

سەرچاوەکانی پیسکردنی ژینگە کامانەن؟

ئایا هەمووان لە پاراستن و خاوێن راگرتنی ژینگە بەرپرسیار نین؟

تۆ بۆ خاوێن راگرتنی چی بە پێویست دەزانیت کە تاکە کەس بیکات؟

رات چییە بەرامبەر بە بوونی دام و دەزگای ژینگە پارێزیی کە کاریان پاراستنی ژینگەیە؟

هەڵوێستت چییە بەرامبەر بەو لایانانەی کە بە شێوەی جیاواز ژینگە پیس دەکەن؟ پێت وایە دەبێت لێپرسینەوەو سزای یاسایی بدرێن؟

# چەند پەیامێکی سەلامەتی بۆ خۆپاراستن لە مین و تەقەمەنی



بەبێ پرسیار کردن مەچۆ بۆ ناوچەیەک کە شارەزا نەبیت



بەرد و شتی دیکە بۆ مین و تەقەمەنی مەهاوێژە



## یاریکردن بە تۆپ شیاوترە لە یاریکردن بە چەکی منداڵان












# یاری بە مین و تەقەمەنی و دەمانچە مەکە
# یاری تۆپی پێ بکە












# چەند ڕێنمایەکی گرنگ

## پێش دەرچونت لە ماڵ:

- هەوڵبدە زانیاری تەواو و دروست لە کەسانی شارەزا وەربگریت سەبارەت بە بوونی مین و تەقەمەنی لەو ناوچەیەی بۆی دەچیت.
- ئاگاداری کەسانی نزیکت بکەوە سەبارەت بە دەرچوونت.
- ئەگەر چوویتە گوندێك یان ناوچەیەکی دیکە پرسیار لە ئەنجوومەن یان کەسانی شارەزا بکە.
- بۆ ئەنجامدانی کارێك لە شوێنێك کە شارەزای نیت باشتر وایە کەسێکت لەگەل دابێ.
- پێویستی وەك مۆبایل و ئاو و خواردن لەگەڵ خۆت ببە.
- پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەیت کە مۆبایلەکەت تەواو بارگاوی (شحن) کرابێت ، یەکەی پێویستیشت هەبێت.

## لەكاتی رۆیشتن و ئە نجامدانی كار:

هیچ چالاكیەك لە ناوچە مەترسیدارەكان ئەنجام مەدە.

زۆر بەوردی و وریایی سەیری دەورو بەری خۆت بكەو سەرنجی نیشانەكانی ناوچەی مەترسی دارەكان بدە.

بەو رێگایانە برۆ كە خەلك بەكاریان هێناوە واتە رێگای گشتین

لە كاتی رۆیشتندا لە دوای یەكدی برۆن و ماوە لە نێوانتان هەبێت.

ئەگەر گومانت لە رێگایەك یان ناوچەیەك هەبوو پێیدا مەڕۆ.

هەول بدە بەرلە تاریك بوون بگەڕێیتەوە ماڵەوە.